# ڕێکەوتننامەی

## لەناوبردنی هەموو جۆرە
## جوداکارییەك لە دژی

# ئافرەتان

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

د. ناصح قەرەداخی



# ڕێکەوتننامەی
# لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکارییەك
# لە دژی ئافرەتان

پەسەند کراوی کۆمەڵەی
گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان

١٩٧٩/١٢/١٨

د. ناصح قەرەداخی
لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی

# رێکەوتننامەی
# لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکارییەك لە دژی
# ئافرەتان (سیداو)

## پەسەندکراوی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان

**١٩٧٩/١٢/١٨**

پاش چەندەها ساڵ هەوڵ و کۆششی نێو نەتەوەیی بۆ پاراستن و بەرەودان بە مافەکانی ئافرەتانی جیهان بەدەسپێشخەریی کۆمیسیۆنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بارودۆخی ئافرەتان کە خۆی لە ساڵی ١٩٤٧ دا دامەزراوە ، بیست ساڵ لەمەو بەر لە بەرواری ١٩٧٩/١٢/١٨ دا کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان رێکەوتننامەیەکی گرنگی پەسەند کرد کە تایبەت بوو بە مافی ئافرەت، ئەویش (***رێکەوتننامەی لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکارییەك لە دژی ئافرەتان*** ) بوو کە سەردێڕی ناوە ئینگلیزی یەکەی دەبێ بە ( سیداو– CEDAW) و زیاتر بەو ناوەوە دەناسرێ.

لە نێوان ساڵانی ١٩٤٩–١٩٥٩ دا ئەم کۆمیسیۆنە چەند رێکەوتنێکی ئامادە کرد لەوانەش ***رێکەوتننامەی مافە سیاسی***



***یەکانی ئافرەتان*** و ***رێکەوتننامەی رەگەزنامەی ئافرەتی شووکردوو***. ساڵی ١٩٦٧یش ***جارنامەی لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان*** بڵاوکرایەوە. هەرچەندە ئەم جارنامەیە کاریگەری ئەخلاقی و سیاسی هەبوو لەسەر وڵاتەکان بەڵام وەك رێکەوتننامە, وڵاتەکانی ناچارنەدەکرد بۆ پەیرەوی کردن. لەبەرئەوە کۆمیسیۆن کەوتە هەوڵی ئەوەی رێکەوتننامەیەك ئامادە بکات ئیلزامی هەبێ و سەرەنجام ***رێکەوتننامەی لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکار یەك لە دژی ئافرەتان*** خرایە بەردەمی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە ١٩٧٩/١٢/١٨ دا پەسەند کردا. رۆژی ١٩٨١/٩/٣، سی رۆژ پاش ئەوەی بیستەمین وڵات رێکەوتننامەکەی پەسەند کرد، رێکەوتننامەکە چووە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە و هەوڵی یاسایی کردنی مافەکانی ئافرەتان بەرجەستە بوو.

ئەوەی خوارەوە دەقی تەواوی رێکەوتننامەکەیە.

# ڕێکەوتننامەی
# لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکارییەك لە دژی ئافرەتان

### *لەکاتێکدا کە وڵاتە لایەنەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە،*

*بەئاگان* لەوەی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان جەخت لەسەر بڕوابوون بە مافە بنچینەیی یەکانی مرۆڤ و کەرامەت و نرخی هەموو تاکێکی مرۆڤ و یەکسانیی مافی پیاو و ئافرەت دەکاتەوە،

*بەئاگان* لەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ جەخت لەسەر بنەمای قبووڵ نەکردنی جوداکاری دەکاتەوە و جاڕی ئەوە دەدا کە هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی ویەکسانیی ماف و کەرامەت لەدایك دەبن و هەموو ماف و ئازادی یەکانی ڕێکەوتننامەکە هەموو کەسێك دەگرێتەوە، بەبێ هیچ جۆرە جیاوازییەك، بە جیاوازی لەسەر بنچینەی سێکسیشەوە،

*بەئاگان* لەوەی کەوا ئەو وڵاتانەی ڕێکەوتننامە نێوەنەوتەوەیی یەکانی لەمەڕ مافەکانی مرۆڤیان ئیمزا کردووە پێویستە مافی یەکسان بۆ پیاو و ئافرەت دابین بکەن بۆ بەرخورداربوون لە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و مەدەنی و سیاسی یەکان،



*ئەوەیان لەبەرچاوە* کە ئەو ڕێکەوتننامە نێونەتەوەیی یانەی لەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو ئاژانسە تایبەتمەندانەدا هاتوونەتە کایەوە برەو بە یەکسانیی مافەکانی پیاوان و ئافرەتان دەدەن،

*بەمەراقن* لەوەی کە لەگەڵ ئەو هەموو میکانیزمانەشدا ، هێشتا جیاوازی کردنێکی زۆر لە دژی ئافرەتان بەردەوامە،

*ئەوەشیان لەیادە* کە جوداکاری دژی ئافرەتان پێشێل کردنی بنەمای یەکسانی یە لە ماف و کەرامەتی مرۆڤدا و کۆسپێکە لە ڕێی بەشداری کردنی ئافرەتاندا بە شێوەیەکی یەکسان لەگەڵ پیاواندا لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیریی وڵاتەکانیاندا، هەروەها ڕێ لەگەشەی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵگا و خێزان دەگرێ و ناهێڵێ ئافرەتان هەموو تواناکانیان بخەنە کار بۆ خزمەتی وڵات و مرۆڤایەتی،

*بەمەراقن* لەوەی لە بارودۆخی هەژاریدا ئافرەتان کەمترین ڕێژەی خواردن و خزمەتی تەندروستی و خوێندن و راهێنان و بواری کارکردنیان بۆ دەرەخسێ،

*دڵنیان لەوەی* دامەزرانی سیستەمی ئابووری نوێی جیهانی لەسەر بناغەی یەکسانی و دادپەروەری بەشێوەیەکی بەرچاو هاوبەشی دەکا لە برەودان بە یەکسانی لەنێوان پیاوو ئافرەتدا،

جەخت *لەسەر ئەوە دەکەنەوە* کە لەناوبردنی ئەپارتاید و هەموو جۆرەکانی رەگەزپەرستی و فاشیزم و کۆلونیالیزم و نیۆکۆلۆنیالیزم و پەلامار و

داگیرکردنی وڵاتان و باڵادەستی و دەست وەردانە ناو کاروباری وڵاتانی تر، هەموو پێویستن بۆ بەرخورداربوونی تەواو  پیاو و ئافرەت لە مافەکانیان،

*پێ لەسەر ئەوەدا دەگرن* کە پتەوکردنی ئاسایش و ئاشتی نێونەتەوەیی، خاو بوونەوەی گرژیی نێونەتەوەیی، هاوکاریی بەرامبەری نێوان وڵاتەکان بەبێ گوێدانە سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی، چەك داماڵینی گشتی و تەواو، بەتایبەتیش چەك داماڵینی ناوکی لەژێر کۆنترۆڵی مەحکەمی نێونەتەوەیی دا، دووپات کردنەوەی بنەماکانی دادپەروەری، یەکسانی و سوودمەندیی دوولایەنی لە پەیوەندی یەکانی نێوان دەوڵەتەکاندا و بەدی هاتنی ماف میللەتانی ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالی و داگیرکراو بۆ چارەی خۆنووسین و سەربەخۆیی، هەروەها ڕێزگرتن لە سەروەریی نەتەوەیی و یەکپارچەیی خاك، ئەمانە هەموو بەرەو بە پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دەدەن و دەرەنجامەکەشیان بەشداری دەکا لە یەکسانیی تەواوی نێوان پیاو و ئافرەتدا،

*دڵنیان* لەوەی پەرەسەندنی چروپڕی هەر وڵاتێك و خۆشگوزەرانیی جیهانی و مەسەلەی ئاشتی پێویستیان بەوپەڕی  بەشداریی کردنی ئافرەتان هەیە بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ پیاودا لەهەموو بوارەکاندا،

*ئەوەشیان لەخەیاڵە* کەوا بەشداریی ئافرەت چەند مەزنە لە خۆشگوزەرانیی خێزان و پەرەسەندی کۆمەڵگادا و هێشتا وەکوو پێویست پێی نەزانراوە، گرنگیی کۆمەڵایەتی دایکایەتی و ڕۆڵی هەردوو باوان لە خێزان و



پەروەردەکردنی منداڵدا چەندە، هەروەها بەئاگان لەوەی ڕۆڵی ئافرەت لە وەچەخستنەوەدا نابێ بکرێتە بنچینەی جوداکاری بەڵکوو پەروەدەکرنی منداڵ بەرپرسیارێتیی هاوبەشی نێوان پیاوو و ئافرەت و کۆمەڵگایە بەگشتی،

*بەئاگان* لەوەی گۆڕانکاری لە ڕۆڵی تەقلیدیی پیاو و هەروەها ڕۆڵی ئافرەتیش لە ناو کۆمەڵگا و خێزاندا پێویستن بۆ ئەوەی یەکسانیی تەواو لەنێوان پیاو و ئافرەتدا بەدی بێت،

*لێبڕاون* بۆ ئەوەی ئەوبنەمایانە جێبەجێ بکەن کەوا لە جاڕنامەی لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان دا هاتوون، وە بۆ ئەو مەبەستەش ڕێو شوێنی پێویست بگرنە بەر بۆ نەهێشتنی ئەو جۆرە جوداکاری یانە بە هەموو جۆرو شێوەکانیەوە،

***بۆیە لەسەر ئەمەی خوارەوە ڕێکەوتوون:***

# بەشی یەکەم

**بەندی ١**

بەمەبەستی ئەم ڕێکەوتننامەیە، واژەی " جوداکاری لە دژی ئافرەتان" بە مانای هەرجۆرە جیاکردنەوە و بەدەرکردن و سنووردارکردنێکە لەسەر بناغەی سێکس کە بۆ مەبەستی یان دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە، یان پووچ کردنەوەی دان پیانان و بەرخورداربوون و پیادەکردنی ئافرەت، شووی کردبێ یان نا وە لەسەر بنچینەی یەکسانیی لەگەل پیاودا، بۆ مافەکانی مرۆڤ و ئازادی یە بنچینەیی یەکان لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و مەدەنی و هەر بوارێکی تردا.

**بەندی ٢**

وڵاتە لایەنەکان جوداکاری لە دژی ئافرەتان بە هەموو جۆرەکانیەوە مەحکووم دەکەن و ڕازین بەوەی بێ دواکەوتن هەموو شێوازێکی لەبار بەکاربێنن بۆ گرتنەبەری سیاسەتێك بۆ لەناوبردنی جوداکاری لە دژی ئافرەتان و ، بۆ ئەم مەبەستەش، ئەم کارانە ئەنجام دەدەن:

أ. بەرجەستەکردنی بنەمای یەکسانی نێوان پیاوو ئافرەت لە یاسای نیشتمانی یان هەر یاسایەکی تری گونجاودا ئەگەر تا ئێستا بەرجەستە نەکرابێ، وە دڵنیا بوون لەوەی ئەم بنەمایە لە ڕێگەی یاسا یان



هەر ڕێگەیەکی تری لەبارەوە بەشێوەیەکی واقیعی پراکتیزە دەکرێ“

ب. گرتنەبەری ڕێوشوێنی یاسایی یان هی تر، بە سزاشەوە ئەگەر لەبار بوو، بۆ لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکاری یەك لە دژی ئافرەتان“

ت. دامەزراندنی پاراستنی یاسایی بۆ مافەکانی ئافرەت لەسەر بنچینەی یەکسانی لەگەڵ پیاودا و دڵنیابوون لە پاراستنی واقیعیی ئافرەتان لەهەموو جۆرە جوداکاری یەك لەڕێگەی دادگای میللی بەتواناو دامەزراوەی گشتیی ترەوە“

پ. خۆبەدوورگرتن لە هەر جۆرەکار و کردارێکی جوداکاری لەدژی ئافرەتان و دڵنیابوون لەوەی دەستەڵات و دامەزراوە گشتی یەکان بەپێی ئەم ئیلزامە دەجووڵێنەوە“

ج. گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنیکی گونجاو بۆ لەناوبردنی هەموو جۆرە جوداکاری یەك لە دژی ئافرەتان لەلایەن هەر کەس و ڕێکخراوو دەزگایەکەوە“

ح. گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی گونجاو، بە یاسادانانیشەوە، بۆ گۆڕین یان پووچ کردنەوەی هەر یاسا و ڕێساو عادەت و کردەوەیەکی مەوجوود کە جوداکاری لە دژی ئافرەتان دەگەیەنێ“

خ. چاکردنی هەموو ئەو بڕگانەی یاسای سزادانی نیشتمانی کە جوداکاری لەدژی ئافرەتان دەگەیەنن.

**بەندی ٣**

وڵاتە لایەنەکان لەهەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی لە بورای سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری دا، هەموو رێوشوێنێکی لەبار ، بەیاسا دانانیشەوە، دەگرنە بەر، بۆ بەدیهێنانی پەرەسەندن و پێشکەوتنی تەواوی ئافرەتان، بە مەبەستی زامن کردنی بەرخورداربوون و پیادەکردنیان بۆ مافەکانی مرۆڤ و ئازادی یە بنچینەیی یەکان لەسەر بناغەی یەکسانیی لەگەڵ پیاودا.

**بەندی ٤**

١. گرتنەبەری هەندی رێوشوێنی تایبەتیی کاتی لەلایەن وڵاتە لایەنەکانەوە بەمەبەستی بەگوڕخستنی یەکسانیی مەوجودی نێوان پیاوو ئافرەت بە جوداکاری لەقەڵەم نادرێ بەپێی ئەو پێناسەیەی لەم رێکەوتننامەیەدا بۆی کراوە، بەڵام ناشبێ بەهیچ جۆرێ ببێتە هۆی هێشتنەوەی ستانداردی نابەرابەرو جیاواز" ئەم رێوشوێنانە ئەبێ وازیان لێ بهێنرێ کاتێ ئامانجەکانی یەکسانی و دەرفەت و مامەڵە بەدی دێن.



٢. گرتنەبەری هەندی رێوشوێنی تایبەتی لەلایەن وڵاتە لایەنەکانەوە، بەو رێوشوێنانەشەوە کە لەم رێکەوتننامەیەدا هاتوون بەمەبەستی پاراستنی دایکایەتی، بە جوداکاری لەقەڵەم نادرێن.

**بەندی ٥**

وڵاتە لایەنەکان هەموو رێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر:

أ. بۆ گۆڕینی هەندێ شێوازی رەفتاری کۆمەڵایەتی و کلتووری لای پیاوان و ئافرەتان، بەهیوای بەدەست هێنانی لەناوبردنی ئەو پێشباوەڕو عادەت و کردەوانەی لەسەر بناغەی بیرۆکەی کەمترایەتی یان باشترایەتی هەرکام لە سێکسەکان یان لەسەر رۆڵی لەگۆران نەهاتووی ئافرەتان و پیاوان دارژراون"

ب. دڵنیابوون لەوەی پەروەردەی خێزانی تێگەیشتنێکی گونجاوی دایکاتی دەگرێتەوە وەك فرمانێکی کۆمەڵایەتی و پێزانینی ئەوەش دەگرێتەوە کە پەروەردەکرن و گەشەکردنی منداڵ رۆڵی هاوبەشی پیاو و ئافرەتە، ئەوەش لەیاد نەچێ کە لە هەموو حاڵەتێکدا بەرژەوەندی منداڵەکان لە پێش هەموو شتێکەوە حسابی بۆ دەکرێ.

**بەندی ٦**

وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار، بە یاسا دانانیشەوە، دەگرنە بەر بۆ سەرکوت کردنی ئیستیغلال کردنی لەش فرۆشیی ئافرەتان و هەموو جۆرە بازرگانی کردنێك بە ئافرەتەوە.

## بەشی دووەم

**بەندی ٧**

وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنەبەر بۆ لەناوبردنی جوداکاری لە دژی ئافرەتان لە ژیانی سیاسی و گشتیی وڵاتدا و ، بەتایبەتیش، دڵنیا دەبن لە دابین کردنی ئەم مافانە بۆ ئافرەتان، یەکسان وەك پیاوان:

أ. دەنگدان لەهەموو هەڵبژارنێك و ریفراندۆمێکی گشتیدا و دەرفەتی خۆهەڵبژاردن بۆ هەموو ئەو دەزگایانەی بەگشتی هەڵ دەبژێردرێن“

ب. بەشداری کردن لە دانان و ڕاپەراندنی سیاسەتی حکومەتدا و بەشداری کردن لە دامەزراوە گشتی یەکاندا و ئەنجامدانی هەر کاروبارێکی گشتی لەهەموو ئاستەکانی حکوومەتدا“



ت. بەشداری کردن لەو ڕێکخراوە و کۆمەڵە ناحکوومەتیانەدا کە پەیوەندی یان بە ژیانی گشتی و سیاسیی وڵاتەوە هەیە“

**بەندی ٨**

وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنەبەر بۆ ئەوەی دابینی ئەوەبکەن ئافرەتان بتوانن، یەکسان وەك پیاوان و بەبێ هیچ جوداکاری یەك، دەرفەتی ئەوەیان هەبێ نوێنەرایەتی حکوومەتەکانیان بکەن لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی و بەشداری بکەن لە ڕێکخراوە نێونەتەوەیی یەکاندا.

**بەندی ٩**

١. وڵاتە لایەنەکان مافی یەکسان وەك پیاوان بە ئافرەتان دەدەن بۆ بەدەست هێنان و گۆڕین و هێشتنەوەی ڕەگەزنامەیان. وە بەتایبەتی دابینی ئەوە دەکەن کەوا لەکاتی بەهاوسەربووندا نە شووکردن بە کەسێکی نامۆ و نە گۆڕینی ڕەگەزنامە لەلایەن مێردەوە خود بەخود نابنە هۆی ئەوەی ڕەگەزنامەی ژنەکە بگۆڕێ یان بێ ڕەگەزنامەی بکات یان ناچاری بکات ڕەگەزنامەی مێردەکەی وەربگرێ.

٢. وڵاتە لایەنەکان مافی یەکسان وەك پیاوان بۆ ئافرەتان دابین دەکەن لەبورای ڕەگەزنامەی منداڵەکانیاندا.

## بەشی سێیەم

**بەندی ١٠**

وڵاتە لایەنەكان هەموو ڕێوشوێنیكی لەبار دەگرنە بەر بۆ بنەبڕ كردنی جوداكاری لەدژی ئافرەتان بەمەبەستی دابین كردنی مافی یەكسان وەك پیاو لەبورای خوێندن دا و بەتایبەتیش بۆ دابین كردنی ئەمانەی خوارەوە لەسەربناغەی یەكسانی لەگەڵ پیاواندا:

أ. هەمان هەلومەرج بۆ كار و ڕێنمایی پیشەیی، بۆ بەرخورداربوون لە خوێندن و بەدەست هێنانی بڕوانامە لە هەموو جۆرە دامەزراوە پەروەردەیی یەكاندا لە شارو لە گوند" ئەم یەكسانی یەش دەبێ لە قۆناغی پێش قوتابخانەو گشتی و تەكنیكی و خوێننی باڵای پیشەیی و تەكنیكی و هەموو جۆرەكانی ڕاهێنانی پیشەیی دا هەبێ"

ب. دەستەبەربوونی هەمان مەنهەج و ئەزموون و فێركاری خاوەنی هەمان ئاستی بڕوانامە و قوتابخانە و كەلوپەلی هەمان ئاست"

ت. لەناوبردنی هەموو جۆرە چەمكێكی دۆگماتیكی دەربارەی ڕۆڵی پیاوو ئافرەت لە هەموو ئاستەكان و شێوەكانی خوێندن دا بە هاندانی خوێندنی هاوبەش



و هەر جۆرە خوێندنێكی تر كە یارمەتی ئەم ئامانجە بدات، بەتایبەتی بە پێداچوونەوەی كتێبەكان و بەرنامەكانی قوتابخانە و گونجاندنی شێوازەكانی فێركردن"

پ. هەمان دەرفەت بۆ كەڵك وەرگرتن لە زەمالە و شێوازەكانی تری كۆمەكی خوێندن"

ج. هەمان دەرفەت بۆ بەرخورداربوون لە بەرنامەكانی درێژەدان بە خوێندن وەك بەرنامەكانی خوێندەواركردنی گەوەركان ، بەتایبەتیش ئەوانەی بەمەبەستی كەم كردنەوەی هەرچی زووتری ئەو بۆشایی یەیە كە لە نێوان خوێندەواری پیاو و ئافرەتدا هەیە"

ح. كەم كردنەوەی ڕێژەی وازهێنانی قوتابییانی كچ لە خوێندن و بەگەڕخستنی بەرنامە بۆ ئەو كچ و ئافرەتانەی پێش وەخت وازیان لە قوتابخانە هێناوە"

خ. هەمان دەرفەت بۆ بەشداری كرنی چالاكانە لە وەرزش و پەروەردەی جەستەیی دا"

د. دەستەبەربوونی زانیاریی پەروەردەیی تایبەتی و یارمەتیدانی دابین كردنی تەندروستی و خۆشگوزەرانی بۆ خێزان بە زانیاری و ئامۆژگاریشەوە دەربارەی ڕێكخستنی خێزان"

**بەندی ١١**

١. ولاَتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر بۆ بنەبڕ کردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان لە بواری دەمەزراندندا بە مەبەستی دابین کرنی هەمان ئەو مافانە، یەکسان وەك پیاو، بەتایبەتی:

أ. مافی کارکردن وەك مافێکی لە مرۆڤ دانەبڕاو“

ب. مافی هەمان دەرفەتی دامەزراندن، لەوانەش بەکارهێنانی هەمان مەرج و پێویستی لە هەڵبژاردندا بۆ دامەزراندن“

ت. مافی ئازادی هەڵبژاردنی کارو پیشە، مافی تەرفیع و ئاسایشی کاری و هەموو سوودمەندی و هەلومەرجەکانی خزمەت و مافی ڕاهێنانی پیشەیی و ڕاهێنانی دووبارە“

پ. مافی پاداشت و قەرەبوو و مافی مامەڵەی یەکسان لە ئیشی یەکساندا و مافی یەکسانی لە هەڵسەنگاندنی چۆنایەتی ئیش کردندا“

ج. مافی ئاسایشی کۆمەلاَیەتی، بەتایبەتی لەکاتی خانەنشینی و بێکاری و نەخۆشی و پەککەوتەیی و پیری و جۆرەکانی تری نەتوانینی کارکردندا، هەروەها مافی مۆلەتی بەمووچە“



ح. مافی پاراستنی تەندروستی و مافی سەلامەتی لە بارودۆخی کاردا، لەوانەش پاراستنی فرمانی وەچەخستنەوە.

٢. بەمەبەستی ڕێنەدان بە جوداکاری لەدژی ئافرەتان لەسەر بناغەی شووکردن یان دایکایەتی و بەمەبەستی دابین کردنی مافی کارکردنیان، ولاَتە لایەنەکان ڕێوشوێنی لەبار دەگرنەبەر بۆ:

أ. قەدەغەکردنی، کە بۆی هەیە سەپاندنی سزاشی لەگەڵدا بێ، لەسەرکار دەرکرنی ئافرەت بە بیانووی مۆڵەتی دووگیانی و دایکایەتی یەوە ، هەروەها قەدەغەکردنی جوداکاری لە دەرکردندا لەسەر بناغەی باری هاوسەرداری“

ب. هێنانەکایەی مۆڵەتی دایکایەتی بەمووچەوە یان لەگەڵ سوودی کۆمەلاَیەتیی قابیلی بەراوردا بەبێئەوەی ببێتە هۆی لەدەست دانی کار و پلەو دەرماڵە کۆمەلاَیەتییەکانی پێشووی“

ت. هاندانی دابین کردنی ئەو خزمەتگوزاری یە کۆمەکی یە کۆمەلاَیەتی یانەی وا لە باوان دەکەن بتوانن ئەرکەکانی خێزانییان لەگەڵ بەرپرسیارێتیی کاری و بەشداری کردنی ژیانی گشتی دا گرێ بدەن،

بەتایبەتیش بە برەودان بە دامەزراندن و پەرەپێدانی تۆڕێك دامەزراوەی بایەخدان بە منداڵ“

پ. دەستەبەرکرنی پاراستنی تایبەتی بۆ ئافرەت لە کاتی دووگیانیدا لەو کارانەی کە دەرکەوتووە زیانیان بۆی هەیە.

٣. ئەو یاسایانەی پارێزەری ئەو مەسەلانەن کە لەم بەندەدا هاتوون پێویستە ناوبەناو لە بەر ڕۆشنایی زانیاری زانستی و تەکنۆلۆجیدا چاویان پێدا بخشێنریتەوەو بەپێی پێویست دەسکاری بکرێن ، لابرێن یان فراوان بکرێن.

**بەندی ١٢**

١. وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر بۆ لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان لە بواری بایەخی تەندروستی دا بە مەبەستی دابین کردنی، لەسەر بناغەی یەکسانیی پیاوو ئافرەت، بەرخورداربوون لە خزمەتگوزارییە تەندروستیەکان، لەوانەش ئەوانەی پەیوەندییان بە ڕێکخستنی خێزانەوە هەیە.

٢. لەگەڵ مەبەستەکانی برگەی یەکی ئەم بەندەشدا، وڵاتە لایەنەکان خزمەتگوزاری گونجاو بۆ ئافرەتان دابین دەکەن لە بواری دووگیانی و منداڵبوون و زەیستانیدا، بە بەخشینی



خزمەتگوزاری خۆرایی بەپێی پێویست، شان بەشانی خۆراکی گونجاو لەماوەی دووگیانی و شیرداندا.

**بەندی ١٣**

وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر بۆ لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان لە بوارەکانی تری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بەمەبەستی دابین کردنی، لەسەر بناغەی یەکسانیی پیاوو ئافرەت، هەمان ماف بەتایبەتی:

أ. مافی سوودمەندی یەکانی خێزان“

ب. مافی قەرزی بانکی و سلفەو و جۆرەکانی تری پشتگیریی دارایی“

ت. مافی بەشداری کردن لە چالاکیی یەکانی سەرگەرمی و وەرزش و هەموو لایەنەکانی تری ژیانی ڕۆشنبیری.

**بەندی ١٤**

١. وڵاتە لایەنەکان ئەو گیروگرفتە تایبەتی یانە لەبەرچاو دەگرن کە ئافرەتانی گوند ڕووبەڕوویان دەبنەوە هەروەها ئەو ڕۆڵە گرنگەش کە ئافرەتی گوند لە مانەوەی ئابووری خێزانەکانیاندا دەیبینن، لەوانەش کارکردنیان لەو کەرتانەی ئابووریدا کە پارەی تێدا نیە، وە ڕێوشوێنی لەبار دەگرنەبەر

بۆ دابین کردنی جێبەجێکردنی مەبەستەکانی ڕێکەوتننامەکە بەسەر ئافرەتی گونددا.

٢. وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر بۆ لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتانی ناوچە گوندییەکان بەمەبەستی دابین کردنی، لەسەر بناغەی یەکسانیی پیاوو ئافرەت، بەشداری کردن و کەڵك وەرگرتنیان لە پەرەسەندنی گوندەکاندا، بەتایبەتیش ئەم مافانەی خوارەوە بۆ ئەو ئافرەتانە دابین دەکەن:

أ. بەشداری کردن لە نەخشەکێشان و جێبەجێکردنی پلانەکانی پەرەپێداندا لەسەر هەموو ئاستەکان“

ب. دەستەبەربوونی دامەزراوەکانی بایەخی تەندروستیی لەبار، لەوانەش زانیاری و ڕاوێژکاری و خزمەتگوزاریی ڕێکخستنی خێزان“

ت. کەڵك وەرگرتنی ڕاستەوخۆ لە بەرنامەکانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی“

پ. بەدەست هێنانی هەموو جۆرە خوێندن و ڕاهێنانێك، ڕەسمی یان نارەسمی، لەوانەش ئەوەی کە پەیوەندی بە خوێندەوارایی بەسوودەوە هەیە، وە لەگەڵ ئەوانەشدا کەڵك وەرگرتن لەهەموو خزمەتگوزاری یە کۆمەڵگایی و کۆمەکی یەکان بە



مەبەستی پەرەدان بە لێهاتوویی یە تەکنیکی یەکانیان“

ج. ڕێکخستنی هەرەوەزی و گرووپی کۆمەك بە خۆ کردن بەمەبەستی بەرخورداربوون لە دەست پێگەیشتنی یەکسان بە دەرفەتە ئابووری یەکان لەڕێگەی دامەزراندن و خۆدامەزراندنەوە“

ح. بەشداری کردن لەهەموو چالاکی یەکانی کۆمەڵگادا“

خ. دەست گەیشتن بە قەرز و سلفەی کشتوکاڵی و ئیمکاناتی بازار و تەکنۆلۆجی گونجاوو مامەڵەی یەکسان لە بواری ریفۆرمی زەوی و کشتوکاڵ و نەخشەکانی دابەشکردنەوەی زەویدا“

د. بەرخورداربوون لە بارودۆخێکی گونجاوی ژیان بەتایبەتی لەبواری خانووبەرەوەو پاکوخاوێنی و کارەبا و دابین کردنی ئاو و گواستنەوە و گەیاندندا.

# بەشی چوارەم

**بەندی ١٥**

١. وڵاتە لایەنەکان بەیەکسانیی ئافرەت لەگەڵ پیاودا لەبەردەم یاسادا قایلن.

٢. وڵاتە لایەنەکان قایلن بەوەی ئافرەت، لە مەسەلە مەدەنی یەکاندا، توانایەکی یاسایی کتومت وەك پیاوی هەیە و هەمان دەرفەتیشی هەیە بۆ نیشاندانی ئەو توانایە. بەتایبەتی دەبێ مافی یەکسان بە ئافرەت بدەن بۆ ئەنجامدانی ڕێکەوتننامەو و بەڕێوەبردنی موڵك و، لەهەموو قۆناغەکانی پرۆسەی دادگاو قەزادا بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

٣. وڵاتە لایەنەکان بەوە ڕازین کە هەموو ئەو ڕێکەوتننامەو میکانیزمە تایبەتییانەی تر لە هەرجۆرێك بن، کە کاریگەریی یاسایی یان هەیە و توانای یاسایی ئافرەت سنووردار دەکەن پێویستە بە پووچ و نەبوو دابنرێن.

٤. وڵاتە لایەنەکان هەمان ماف بۆ پیاوو ئافرەت قایلن لەڕووی ئەو یاسایانەوە کە پەیوەندی یان بە هاتوچۆی مرۆڤەوە هەیە و مافی ئەوەش کە ئازاد بن لە هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوون و ماڵ کردندا.



**بەندی ١٦**

١. وڵاتە لایەنەکان هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار دەگرنە بەر بۆ لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان لە هەموو ئەو مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە هاوسەرداری و پەیوەندی خێزانییەوە هەیە بەتایبەتیش لەسەر بناغەی یەکسانی لەگەڵ پیاودا، ئەمانەی خوارەوە دابین دەکەن:

أ. هەمان ماف بۆ هاوسەردار بوون“

ب. هەمان ماف بۆ ئازادیی هەڵبژاردنی هاوسەر و چوونە ناو هاوسەرداری یەوە تەنیا بە ویست و ڕەزامەندی ئازادی خۆیان“

ت. هەمان ماف و بەرپرسیارێتی لە ماوەی هاوسەرداری و لەکاتی هەڵوەشانەوەیدا“

پ. هەمان ماف و بەرپرسیارێتی وەك باوان، بێگوێدانە باری هاوسەرداری، لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندی یان بە منداڵەکانیانەوە هەیە“ لەهەموو حاڵەتێکدا بەرژەوەندی منداڵەکان لەڕیزی پێشەوە حسابی بۆ دەکرێ“

ج. هەمان ماف بۆ بڕیاردانی ئازادو بەرپرسیارانەی ژمارەو ماوەی نێوانی منداڵەکانیان و دەستەبەرکردنی زانیاری و پەروەردەو هۆکاری پێویست بۆیان تا بتوانن ئەم مافانە پیادە بکەن“

ح. هەمان ماف و بەرپرسیارێتی لەرووی ئەمانەتداری و ویصایە و وەلی ئەمری و گرتنەخۆی منداڵ و هەر بابەتێکی ترەوە کە ئەم جۆرە چەمکە لە یاسای وڵاتدا دەیگرێتەوە، لەهەموو حاڵەتێکدا بەرژەوەندی منداڵەکان لەریزی پێشەوە حسابی بۆ دەکرێ"

خ. هەمان ماڤ شەخسیی وەك ژن و مێرد، لەوانەش ماڤ هەڵبژاردنی ناوی خێزانی و کارو پیشە"

د. هەمان ماف بۆ هەردوو هاوسەر لەرووی خاوەندارێتی و بەدەست هێنان و بەرێوەبردن و ئیدارە کردن وبەرخورداربوون و لەدەست دانی موڵکەوە، چ بێ حساب بێ چ بە نرخێکی بەرچاو بێ.

٢. بەدەزگیران بوون و بەشوودانی منداڵ هیچ کاریگەری یەکی یاسایی نابێ و پێویستە هەمووکارێکی پێویست ئەنجام بدرێ، بە یاسادانانیشەوە، بۆ دیاریکردنی کەمترین تەمەنی هاوسەرداربوون و ناچاری کردنی تۆمارکردنی هاوسەرداربوون لە تۆمارگەیەکی رەسمیدا.



## بەشی پێنجەم

**بەندی ١٧**

١. بەمەبەستی بەدواداچوونی پێشکەوتن لە جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتننامەیەدا دەبێ **کۆمیتەی لەناوبردنی جوداکاری لەدژی ئافرەتان** دابمەزرێ( کە لەمەودوا بە کۆمیتەکە ناو دەبرێ) و پێکهاتبێ لە ١٨ پسپۆری بەتواناو لێهاتوو لە و بوارانەدا کە ڕێکەوتننامەکە باسیان دەکا، کاتێ کە ڕێکەوتننامەکە دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، وە لە ٢٣ پسپۆر پاش ئەوەی سی و پێنجەمین وڵات ڕێکەوتننامەکە پەسەند دەکات. پسپۆرەکان لەلایەن وڵاتەکانەوە لە هاووڵاتی یانی خۆیان هەڵدەبژێردرێن و بە توانای شەخسیی خۆیانەوە کار دەکەن، دابەش کردنی یەکسانی ناوچە جوگرافی یەکان و نوێنەرایەتی شارستانییەت و سیستەمە یاسایی یە سەرەکی یەکانیش لەبەرچاو دەگیرێ.

٢. ئەندامانی کۆمیتەکە بە دەنگدانی نهێنی هەڵدەبژێردرێن لە لیستێکەوە کە لەلایەن وڵاتە لایەنەکانەوە پێشنیار دەکرێ. هەر وڵاتێکی لایەن بۆی هەیە ناوی یەك کەس لە هاووڵاتی یەکانی پێشنیار بکا.

٣. یەکەمین هەڵبژاردن شەش مانگ پاش ئەوە ئەنجام دەدرێ کە ڕێکەوتننامەکە دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. لانی

کەم سێ مانگ پێش بەرواری هەرهەڵبژاردنێك، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان پێویستە بە نامە وڵاتە لایەنەکان ئاگادار بکاتەوە تا لە ماوەی دوو مانگدا ناوزەدی خۆیان پێشنیار بکەن. سکرتێری گشتی پاشان لیستێکی ڕێکخراو بە پێی ئەلفبا لە ناوە پێشنیار کراوەکان ئامادە دەکا لەگەڵ نیشاندانی ناوی وڵاتەکانیاندا و دەیخاتە بەردەم وڵاتە لایەنەکان.

٤. هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمیتەکە لە کۆبوونەوەیەکی وڵاتە لایەنەکاندا دەبێ کە سکرتێری گشتی لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێکی دەخات. لەم کۆبوونەیەدا کە پێویستە لانی کەم دوو سێیەکی وڵاتە لایەنەکان بەشداری تێدا بکەن، ئەو ناوزەدانەی زیاترین دەنگ دەهێنن و زۆرینەی ڕەهای دەنگی نوێنەرانی ئامادەی وڵاتە لایەنەکان لە دەنگ داندا بەدەست دێنن، هەڵ دەبژێردرێن.

٥. ئەندامەکانی کۆمیتەکە بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن. بەهەرحاڵ ماوەی ٩ لە ئەندامانی یەکەم هەڵبژاردن تەنیا دوو ساڵ دەبێ: ناوی ئەم نۆ ئەندامە یەکسەر دوای هەڵبژاردنەکە بە قورعە لەلایەن سەرۆکی کۆمیتەکەوە دیاری دەکرێت.

٦. هەڵبژاردنی ٥ ئەندامەکەی تری کۆمیتەکە بەپێی برگەکانی ٢،٣ و ٤ ی ئەم بەندە دەبێ پاش پەسەندکردن یان بەئەندام بوون لەلایەن سی و یەکەمین وڵاتەوە. ماوەی دوو



لەم پێنج ئەندامە تەنیا بۆ دوو ساڵ دەبێ و ناوەکانیان بە قورعە لەلایەن سەرۆکی کۆمیتەکەوە دیاری دەکرێن.

٧. بۆ پڕکردنەوەی ئەو جێگەیانەی کە ڕەنگە بەهەر هۆیەك چۆڵ ببن، ئەو وڵاتە لایەنەی کە پسپۆرەکەی وازی لەکار هێناوە وەك ئەندامی کۆمیتەکە، دەتوانێ ناوی هاوولاتی یەکی تری پێشنیار بکات، کە ئەمەش پێویستی بە پەسەندکردنی کۆمیتەکە هەیە.

٨. ئەندامانی کۆمیتەکە ، بەرەزامەندی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە سەرچاوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆمەك وەردەگرن بەپێی ئەو مەرج و شێوازەی کۆمەڵەی گشتی بریاری لەسەر دەدات، بەلەبەرچاوگرتنی گرنگیی بەرپرسیارێتیی کۆمیتەکە.

٩. سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان ئیمکانات و کارمەندی پێویست دابین دەکات بۆ ڕاپەراندنی کاریگەرانەی کارەکانی کۆمیتەکە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕێکەوتننامەیەدا.

### بەندی ١٨

١. وڵاتە لایەنەکان ڕازین بەوەی ڕاپۆرتێك بخەنە بەردەستی سکرتێری گشتی بۆ بەرچاوی کۆمیتەکە، دەربارەی ئەو ڕێوشوێنە یاسایی و قەزایی و ئیداریی و هی ترانەی کە گرتوویانەتە بەر بەمەبەستی کاریگەر کردنی بەندو برگەکانی

ئەم رێکەوتننامەیە و هەروەها دەربارەی ئەو پێشکەوتنانەی لەم رووەوە بەدەست هاتووە:

أ. یەك ساڵ پاش ئەوەی رێکەوتننامەکە بە نیسبەت ئەو دەوڵەتەوە دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە" وە

ب. پاش ئەوەش لانی کەم هەر چوار ساڵ جارێك و هەر کاتێکیش کۆمیتەکە داوا بکات.

٢. لە راپۆرەتەکاندا دەکرێ ئەو هۆکار و ئاستەنگانە نیشان بدرێن کە کار لە رادەی بەدی هێنانی ئەو ئەرکانە دەکەن کە ئەم رێکەوتنامەیە داوایان دەکات.

**بەندی ١٩**

١. کۆمیتەکە خۆی رێسای کاری خۆی دادەنێ.

٢. کۆمیتەکە بەرپرسەکانی بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵ دەبژێرێ.

**بەندی ٢٠**

١. کۆمیتەکە لەباری ئاساییدا ساڵانە دوو هەفتە زیاتر کۆنابێتەوەئەویش بۆ پێداچوونەوەی ئەو راپۆرتانەی بەپێ ی بەندی ١٨ی ئەم رێکەوتننامەیە پێشکەش کراون.



٢. لەباری ئاساییدا کۆبوونەوەکانی کۆمیتەکە لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان یان لەهەر شوێنێکی لەباری تر کە کۆمیتەکە بریاری دەدات، ئەنجام دەدرێن.

**بەندی ٢١**

١. کۆمیتەکە لەرێگەی ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ساڵانە راپۆرت دەدا بە کۆمەڵەی گشتی دەربارەی چالاکی یەکانی و دەشتوانێ پێشنیارو ئامۆژگاری یە گشتی یەکانی خۆی بخاتە روو لەسەر بناغەی پشکنینی ئەو راپۆت و زانیارییانەی بەدەستی هێناوە کە لە وڵاتە لایەنەکانەوە پێی گەیشتووە. ئەم پێشنیارو ئامۆژگاری یە گشتی یانە دەبێ لە راپۆرتی کۆمیتەکەدا هەبن هاورێ لەگەڵ تێبینیی وڵاتە لایەنەکاندا، ئەگەر هەبن.

٢. سکرتێری گشتی راپۆرتەکانی کۆمیتەکە دەنێرێ بۆ کۆمیسیۆنی بارودۆخی ئافرەتان بۆ زانیاری.

**بەندی ٢٢**

ئاژانسە تایبەتمەندەکان بۆیان هەیە لەبواری تایبەتمەندێتی ئیشی خۆیاندا نوێنەرایەتی بکەن بۆ چاودێری کرنی جێبەجێکردنی بەندو برگەکانی ئەم رێکەوتننامەیە. کۆمیتەکە دەتوانێ داوا لەو ئاژانسە تایبەتمەندانە بکا راپۆرتی خۆیان

دەربارەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە لەو بورانەدا کەپەیوەندییان بە ئیشی ئەوانەوە هەیە، پێشکەش بکەن.

## بەشی شەشەم

**بەندی ٢٣**

هیچ شتێکی ئەم ڕێکەوتتنامەیە نابێ کار لەو ياسايانە بكا كە لەمانە باشترن بۆ بەدیهێنانی یەکسانیی پیاو و ئافرەت و ڕەنگە هەبن :

أ. لە یاسای وڵاتە لایەنەکەدا"

ب. لە هەر ڕێکەوتننامەو پەیمان و ڕێکەوتنێکی نێونەتەوەیی دا کە وڵاتە لایەنەکە پەیڕەوی دەکا.

**بەندی ٢٤**

وڵاتە لایەنەکان ڕازین بەوەی لەسەر ئاستی وڵات هەموو ڕێوشوێنێکی لەبار بگرنە بەر بەمەبەستی گەیشتن بە بەدیهاتنی تەواوی ئەو مافانەی لەم ڕێکەوتننامەیەدا هاتوون.



**بەندی ٢٥**

١. ئەم ڕێکەوتننامەیە کراوەیە بۆ ئیمزا کردن لەلایەن هەموو وڵاتەکانەوە.

٢. سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتوەکان بە ئەمینداری ئەم ڕێکەوتننامەیە دادەنرێ.

٣. ئەم ڕێکەوتنامەیە قابیلی پەسەندکردنە. داوای پەسەندکردن بە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەسپێردرێ.

٤. هەموو وڵاتەکان دەتوانن ببنە ئەندامی ئەم ڕێکەوتننامەیە. بوونە ئەندام بەوە دەبێ داوای بوونە ئەندام بە سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان بسپێردرێ.

**بەندی ٢٦**

١. هەموو کاتێ هەر وڵاتێکی لایەن بیەوێ دەتوانێ داوای پێداچوونەوەی ئەم ڕێکەوتننامەی بکات بە پێشکەش کردنی داوایەکی نووسراو بۆ بەردەمی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٢. کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیار لەسەر هەر هەنگاوێك دەدا، ئەگەر هەبێ، بۆ لەبەرچاوگرتنی داوای لەم جۆرە.

**بەندی ٢٧**

١. ئەم رێکەوتننامەی دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە لە رۆژی سیهەم (٣٠ هەم) دا پاش ئەوەی بیستەمین داوای پەسەندکردن یان بوونەئەندام دەسپێردرێ بە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٢. بەنیسبەت هەر وڵاتێکەوە کە پاش سپاردنی بیستەمین داوای پەسەندکردن یان بوونە ئەندام، داوای پەسەندکردن یان بوونە ئەندامی خۆی دەسپێرێ، رێکەوتننامەکە لە رۆژی سیهەمی پاش سپاردنی داوای پەسەندکردن یان بوونەئەندامی خۆیدا دەچێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە.

**بەندی ٢٨**

١. سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان دەقی (تحفظاتی) هەر وڵاتێك لەکاتی پەسەند کردن یان بوونە ئەندامدا، وەردەگرێ و بەسەر وڵاتە لایەنەکاندا بڵاوی دەکاتەوە.

٢. تحفظاتیك قبووڵ ناکرێ کە لەگەڵ ئامانج و بابەتی ئەم رێکەوتننامەیەدا نەگونجێ.

٣. هەموو کاتێ کشانەوە لە هەر (تحفظاتیك) مومکینە بە ناردنی یاداشتێك بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەویش هەواڵەکە بە وڵاتەکان رادەگەیەنێ. ئەم یاداشتە لەو رۆژەوەی دەگاتە بەر دەست کاریگەر دەبێ.



**بەندی ٢٩**

١. ئەگەر هەر کێشەیەك لەنیوان دوو وڵاتی لایەن یان زیاتردا لەسەر لێکدانەوەی جیبەجێکردنی ئەم رێکەوتننامەیە بە وتووێژ چارە نەکرا، ئەوا هەر یەکێکیان دەتوانن داوای حوکم دان بکەن. ئەگەر تا شەش مانگ پاش داوای حوکم دان ئەو لایەنانە نەیان توانی لەسەر هەڵبژاردنی دەزگایەك بۆ حوکمدان رێك بکەون ئەوا هەر لایەکیان دەتوانێ داواکە بخاتە بەردەم دادگای دادی جیهانی لە داوایەکدا کە لەگەڵ پەیڕەوی دادگاکەدا بگونجێ.

٢. هەر وڵاتێکی لایەن دەتوانێ، لەکاتی ئیمزا یان پەسەند کردن یان بوونە ئەندامی ئەم رێکەوتننامەیەدا ، ئەوە رابگەیەنێ کە پەیرەوی برگەی یەکی ئەم بەندە ناکات. لەبەرامبەر ئەو وڵاتانەدا کە ئەم (تحفظە یان) نیشان داوە وڵاتە لایەنەکانی تریش ناتوانن کەڵك لەو برگەیە وەربگرن.

٣. هەر وڵاتێکی لایەن کە بە پێی برگەی ٢ی ئەم بەندە (تحفظیان) نیشان داوە دەتوانن هەر کاتێ بیانەوێ لەو تحفظە بکشێنەوە بە یاداشتێك بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان.

**بەندی ٣٠**

ئـەم رێکەوتننامەیـە کـە دەقـی عـەرەبی و چـینی و ئینگلیـزی و فەرەنسایی و رووسی و ئیـسپانیایی یەکـەی هـەموو بەیـەك رادە پـشتیان پـی دەبەسـترێ، لای سـکرتێریی گـشتیی نەتـەوە یەکگرتووەکان دادەنرێ.

*****

***بۆ سەلماندنی ئەمەش*** **ئەوانەی لەخوارەوە ئیمزایان هاتووە و بەپێی پێویست سەرپشك کراون، هەستان بە ئیمزاکردنی ئەم رێکەوتننامەیە.**

*****

تێبینیی وەرگێڕ: وەك دەقێکی یاسایی لە وەرگێڕانی ئەم دەقەدا ئەوپەڕی ئەمانەت بـەکاربراوە و هـەوڵ دراوە ناوەرۆك و چۆنێتیی دەربڕین و تەنانەت فۆرماتی دەقەکەش کتوکت وەك سەرچاوە رەسەنەکە بهێڵرێتەوە.

ئەم دەقە کوردییە یەکەمجار لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٩٩ دا لە رۆژنامەی "برایەتی"دا بڵاوکراوەتەوە

**Convention on the Elimination of All Forms of Discrimination Against Women**
**Kurdish translation by Dr Nasih Qeredaxi**
**nasihqeredaxi@yahoo.com**
**First published in Birayeti newspaper, December 1999**